# به سیفەتی ( الراقي ) لێرە نین، تەنها ئامۆژگاریە بۆ موسڵمانان

پێش گەیاندنی زانیاریەکان:

پەیامم بۆ چوار جۆر کەس :

١ - **السَّاحِر** : ئەو کەسەیە کە بکەرە بۆ درووست کردنی سیحرەکە بە هەموو جۆرەکانیەوە، وە ئەو کەسەیە کە جنۆکەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە بانگ دەکات بۆ استعانة کردن پێیان بۆ درووست کردنی سیحر و جۆرەکانی. ئەو کەسە **کافرە** حوکمەکەی سەربڕینە لە ئەثەرێک هاتووە جەستەکەشی دوای مردن دەسوتێنرێت، وە لەکاتی دەسرگیرکردنی تەوبەی لێ قبوڵ ناکرێت. لە ڕیوایەتێک هاتووە دوای تەوبەش دەکوژرێت بۆیە ئەزانم کۆمەڵێک لە ساحیرەکان ئەم پۆستە دەبینن بۆیە فی الله پێتان ڕادەگەیەنم دەست هەڵگرە و بگەڕێوە بۆ سەر حەق و لای الله تعالی کافر بە بە سیحر و بکەرانی.

٢ - **الزيارة السواحر** : سەردانی کردنی ساحیرەکان ئەو خەڵکەی دەچێتە لای ساحیرەکان بۆ تێکدانی ژیان و حاڵی کەسێک فی الله پێتان ئەڵێم : تەوبە بکەن سوێند بە زاتی الله دووبارە سوێند بە زاتی الله ئەم دەرد و ئازارەی تۆ دەیخەیتە ناو ماڵ و حاڵی کەسێک ڕۆژێک دەرگای تۆ دەگرێتەوە. ئەوە سوننەت و وەعدی الله یە، ابن رجب الحنبلي دەڵێت : هەندێک ستەم و تاوان هەن الله تعالی تۆڵەیان ناخاتە قیامەتەوە بەڵکو

.

لە دونیا دەیکاتە پەند و عیبرەت. وەک چۆن جەرگ و حاڵی خەڵکت تێکدا، وەک چۆن ئاگرت خستە ژیانی خەڵکەوە الله تعالى بەو دەردەت دەباتەوە وە تۆش تەنها بەسەردانی کردنت و بەڕاست دانانی ساحیرەکە ئەوە **کافریت** وە عیبادەتت لێ قبوڵ ناکرێت تا دەشمریت لە قەلەقی و خەمۆکی دەژیت بۆیە تەوبە بکە.

٣ - **المَسْحُور** : ئەو کەسەی سیحری لێکراوە پێش هەموو شتێک موژدەت پێبدەم کە خاوەن ئەجریت تا سیحرەکەت لەسەر نامینێت چرکە بە چرکە ئەجرت بۆ دەنوسرێت لەگەڵ هەر ئاخ و ئۆفێکت خراپە دەخەیتە میزانی ئەو کەسەی سیحری لێت کردووە بۆیە سێ شتت لەسەر واجبە بەتایبەت لەو حاڵەت :

١ - **التوكل المطلق بالله** : پشت بەستنی ڕەها بە الله تعالى، چوونکە ئەم سیحرەی سەرت بە ئیزنی ئەوە وە بە ئیزنی ئەو دەردەچێت و نامینێت.

٢ - **عدم اليأس من رحمة الله** : نا ئومێد نەبوون لە ڕەحمی الله تعالى. دەزانم لە ئازارێک دەژیت کە تەنها خۆت دەزانیت چەندە پڕ ئازاری، بەڵام ئەوە بزانە کەسێک بێ ئومێد نابێت لە ڕەحمی الله مەگەر قەومی کافران نەبێت، بۆیە سەبر بگرە.

٣ - **الدوام على ذكر الله والرقا** : بەردەوام بوون لەسەر زیکر و ڕوقیە خوێندن چوونکە هیچ هێزێک نیە دەربازت بکات جگە لەوانە.

٤ - **الرَاقي** : ئەو مەلا و برایانەی روقیەی شەرعی دەکەن لە الله بترسن و موەحید بن. چوونکە خەڵکانێک دەستیان داوەتە ڕوقیە کە نە لە عیبادەت نە لە زانست دەزانن، وە

.

بێ ئاگان لە دونیا و دەسەڵاتی جنۆکەکان کە توشی خۆیان دەبنەوە ئەگەر بەربەستێکی تەقوایی درووست نەکەیت، وە پێویست و واجبە لەسەر کەسی ڕاقی حافظ القران بێت بۆ ئەوەی هێزەکەت مقابل بێت بەرامبەر شەیتان و جن و ساحیرەکان گەر هەر نەتوانی ببیتە حافظ القران لایەنی کەم ٣٠ ڕۆژ جارێک خەتمێکی قورئانت هەبێت گەر وانەکەیت تووشی سەد دەرد دەبیت چوونکە ڕوقیەمان بۆ چەندین ڕاقی خوێندووە کە بە نەزانانە کەوتوونەتە ناو کاری روقیەوە وە ئەمڕۆکەش بازرگانی دەکەن و پارە و پولی پێ کۆ دەکەنەوە، کە ئەوە قەولی ڕاجح ئەوەیە درووست نیە وە ئامۆژگاریتان دەکەم هەرگیز پشت بە جنۆکەکان مەبەستن بۆ دەرهێنان و دۆزینەوەی نوشتە و سیحرە چوونکە **شیرکە** وە فیتنەی کۆمەڵایەتیە، وە جنۆکەکان درۆزنترین مەخلوقن بۆیە نابێت بڕوایان پێ بکەن بۆ درکاندنی ناوەکان بۆیە تەقوای اللە تعالی بکەن.

## تێبنییەک ...

خۆشەویستانم لێرە باسی هەر نیشانە و شتێک کرا تۆ یەکسەر لە خۆتی مەکە وەسوەسە. مەرج نیە مەرجێک یان دوان یان سێیان لێت هەبێت بەواتای ئەوە بێت کە تۆ فلان سحرت لێکراوە. ئەگەر هاتوو زۆرینەی لێت هەبوو ئەوە پێویست دەکات عیلاج بەکار بێنیت بۆ ئەوەی اللە کارت ئاسان بکات.

.

## بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

به کورتی و پوختی دەمەوێت ئاماژە بە چەند جۆر و بەشێکی سیحر بکەین کە زۆر بەربڵاوە وە زۆر کاری پێ دەکرێت لەلایەن ساحیرەکانەوە وە توشبووەیەکی یەکجار زۆری هەیە پەنا بە الله تعالی.

به شێوەیەکی گشتی لەڕووی جۆرەوە سیحر سێ جۆری هەیە :

یەکەم : السحر الأبیض : سیحری سپی

دووهەم : السحر الأحمر : سیحری سوور

سێ یەم : السحر الأسود : سیحری ڕەش

یەکەم : **السحر الأبیض** : سیحری سپی بریتیە لە : بە سیحری سرووشتی ناسراوە، بە واتای پشت بەستن بە شتانێک خارجی سرووشت بێت بە استیعانە کردن بە جنۆکەکان بۆ دابین کردن و پاراستنی ژیانێکی دوور لە کێشە وە بەکار دێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بەتایبەت بۆ پاراستنی نێوان دوو دڵ. ئەم جۆرە سیحرە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فیرعەونەکان وەک کەشف کراوە ئافرەتە میسریە کۆنەکان بەکاریان دەهێنا بۆ ڕاکێشانی دڵی پیاوەکان وە کۆنترۆڵ کردنی پیاوەکان و کەمۆکردنیان بۆخۆیان یاخود بەکاریان دەهێنا بۆ درووست کردنی پشتێنێکی ئەمنی خارج و داخلی وەڵاتی میسر زیاتر بۆ ئەم کارانە بەکار دەهێنران :

.

.

* بۆ چارەسەری نەخۆشی و تاعونەکان.

* بۆ پێشبینی کردنی داهاتوو .

* بۆ پوچەڵ کردنەوەی سیحری خراپ .

* دوورخستنەوەی ڕۆحە پیسەکان.

* بۆ جێبەجێ کردنی ئاواتێک بەتایبەت لە کار و دیراسات.

* ڕازی کردنی هاوسەران بەرامبەر یەک.

* ڕاکێشانی عیشق و دڵ و خۆشەویستی.

* بۆ بەرهەمە کشتوکاڵیەکان.

* بۆ دۆزینەوەی شتە ونبووەکان

* کۆنترۆڵکردنی کەش و هەوا.

ئەم جۆرە سیحرە پێویستی بە ساحیرێکە دوور بێت لە مشروب و زینا. وە کەرەستەکان بریتین لە : چەقۆ و کتێبە کاهینیەکان بە تایبەت بورج و شەعوەذە تێکەڵیەکان و بەرد و دوکەڵ و ڕۆنی بەراز و کەمتیار.

دووهەم : **السحر الأحمر** : سیحری سوور بریتیە لە : جۆرە سیحرێک کە بە ڕێگەی بایەوە دەکرێت تێیدا پشت دەبەسترێت بە هێزی جن بۆ جێبەجێ کردنی کار و سودێک بۆ

.

.

کەسی ساحیر . بەم جۆرە سیحرە جنۆکەکان بۆ بەشێکی جەستەی مرۆڤەکان دەنێردرێت بەتایبەت **الجن العاشق** بەم جۆرە سیحرە دەخرێتە جەستەی کچ و کوڕەکەوە .

سێ یەم : **السحر الأسود** : سیحری ڕەش : ئەم جۆرە سیحرە لە ترسناکترین و خراپترین و خێراترینی جۆری سیحرەکانە بۆ کاریگەری بوون تا ڕادەی خۆکوشتن، کەم کەس هەن ئەم جۆرە سیحرەیان هەبێت و خۆیان نەکوشتبێت . . . ئەم جۆرە سیحرە بەم شتە پیسانەوە دەکرێت :

* خوێنی حەیزی ئافرەت تێکەڵ کردنی بە سورەتەکانی قورئان.

* پیسایی بەراز و کەمتیاری مێ تێکەڵ کردنی بە سورەتەکانی قورئان.

* سوتاندنی ناوی کەسی سیحر لێکراو.

## چۆن ئەم سیحرە بۆ کەسی سیحر لێکراو دەنێردرێت ؟

بەڕێگەی پشت بەستن بە جنۆکەکانەوە دەیان نێرن بۆ شێت کردن و ئازار دان و خۆکوشتن و نەخۆشیە قورسەکان

## بۆ ناوی لێنراوە سیحری ڕەش ؟

.

.

چوونکە کەسی ساحیر دەبێت لە شوێنێکی تاریک و پیس دانیشێت بە سوژدە بردن بۆ تەرمایی و شەیتانە ئامادە بووەکان و خوێندنەوەی تەلەمیس و تعویذاتی شەیتانی بۆ بانگ کردنی ڕۆحە پیسەکان دەبێت کەسی ساحیر بەردەوام **کوفر** بە الله تعالی و کەلامەکەی بکات وە جوێن بە فریشتەکان بدات . . . دەبێت کەسی ساحیر لە جەنابەت بێ وە کەمێک خوێنی حەیزی خواردبێت و هتد . . . وە ئەم جۆرە سیحرە بەڕێگەی چەند لەفز و عیبارەتێکی **کوفر**ی شەیتانی دەبێت لەسەر جەستەی ئافرەتێک بنوسرێت بۆ ئەوەی خێراتر کاریگەری درووست بکات . . . وە ئەو کەسەی ئەم جۆرە سیحرەی لێدەکرێت دەبێت نزیکەکانی ئاگاداری خۆیان بن چوونکە بەهێزی سیحرەکە کاریگەری لەسەر ئەوانیش دەکات بۆیە زۆر مەترسیدارە . . .

ئەم جۆرانەش بەربڵاون :

١- سحر الصرف أو سحر التفريق : سیحری جیاکردنەوە.

٢ - سحر العطف - المحبة أو التولة : سیحری خۆشەویستی.

٣ - سحر التخيل : سیحری گۆڕین.

سێ جۆری هەیە :

* **السحر الهوائي** : سیحری هەوایی ئەم جۆرە سیحرە هەرچەندە بایەکە خێرابێت کاریگەری سیحرەکە زۆرتر دەبێت.

.

* **السحر المائي** : سيحری ئاوی . ساحیر ئەم جۆرە سیحرە لە دەریاکان و  بیرەکان و کونە مەزراکان و بیری مرافقەکان فرێ دەدات بەرێگەی جنۆکەکانەوە.

* **السحر الناري** : سیحری ئاگری ئەم جۆرە سیحرە لەنزیک ئاگر دەکرێت وە ساحیر دەیخاتە فرنەوە یان سۆپا یان سەرچاوەیەکی ئاگرەوە

* **السحر الترابي** : سیحری خۆڵی کەسی ساحیر دەیخاتە ژێر خۆڵەوە یان لە رێگاکان یاخود گۆڕستانەکان یاخود ماڵەکان دەیشارێتەوە بەرێگەی جن و مرۆڤەکانەوە.

٤ - سحر المرض : سیحری نەخۆشی

٥ - سحر الجنون : سیحری شێت بوون

٦ - سحر المأكول : سیحری خواردن

٧- سحر المشروب : سیحری خواردنەوە

٨ - سحر المرشوش : سیحری ڕشێنراو

٩ - سحر الحيوانات : سیحری ئاژەڵان ( سەگ و پشیلە و مار ) بەتایبەتی

١٠ - سحر النجاسة : سیحری پیسی

١١ - سحر تسقيط الجنين : سیحر بۆ لەبار بردنی منداڵ.

ئەوانەی باسمان کرد کەمێک لە جۆرەکانن کە زۆر باون لەناو کۆمەڵگای خۆمان ان شاء الله باسیان دەکەین و نیشانە و چارەسەریەکان دەخەینە ڕوو بە ویستی الله تعالی وە بکەرانی ئەم جۆرە سیحرانە **کافر**ن بە الله تعالی.




## سیحری خواردن ( سحر المأكول )

جۆرە سیحرێکە کە ساحیر لە ڕێگەی سوتاندنی ناوی کەسی سیحر لێکراوە وە لە ڕێگەی بەکار هێنان و خوێندنەوەی چەند شعوەذەیەکی ئەرقامی و فەلەکی و شەیتانی درووستی دەکات وە دەکرێتە ناو خواردنەوە دەدرێت بە کەسی سیحر لێکراوەکە

### دیارترین نیشانەکانی سیحری خواردن ( سحر المأكول ) :

١ - ژانە سک بەتایبەت ناوەڕاستی معدة ژانەکە بەردەوام نیە بەڵام زۆربەی کاتەکان ژاندارە وە جار جار ڕشانەوە دەکات.

.

٢ - کاتێ ڕوقیەی بۆ دەخوێندرێت ژانی سکی زیاد دەبێت و ڕشانەوەی بەردەوام دەکات تەبعەن گەر سیحرەکە تازە لێکراو بێت گەر کۆن بێ ڕشانەوەی بۆ زەحمەت دەبێت.

٣ - زۆر غازاتی سک.

٤ - لەکاتی ڕوقیە خوێندندا هەست بە هەڵپەڕینی سکی دەکات.

٥ - هەست بە لەرزین و حەرەکەی سک و سنگی دەکات کە وا هەست دەکات خەریکە شتێک لە سکی دەردەچێت بەڵام ناتوانێت دەربچێت بەتایبەت لەکاتی خوێندنەوەی قورئان.

٦ - هەست بە گەرمی دەکات لە سکیدا بەڵکو جەستەی بە گشتی بەتایبەت لەکاتی ڕوقیە.

٧ - دەرچوونی بۆنێکی ناخۆش لە معیدە لە ڕێگەی دەمەوە وەکاتێ گوێ بیستی روقیە بێت زیاتر دەبێت.

٨ - دڵ نەچوون بۆ خواردن.

٩ - بۆ ژن ( تێکچوونی سوڕی مانگانە ) وە ژانی زیاد لەو عادەتەی کە هەیان بوو.

١٠ - لاواز بوون و بێهێز بوونی چاوەکان زۆر کات بەرەو غەیم بوون دەچێت.

١١ - سڕبوونی پشتە مل و قاچ و دەستەکان بەتایبەت چەپەکان.

١٢ - دڵ تەنگ بوونێکی سەیر بەتایبەت لەدوای عسرەوە.

.

.

١٣ - هەناسە تەنگی بەتایبەت لە خەو و شەوان.

١٤ - سوور هەڵگەڕان و ڕەش هەڵگەڕان لەکاتی روقیەدا.

١٥ - بینینی خەونی بەردەوام بە تێکەڵی و ئاژەڵان بەتایبەت سەگ و مار و پشیلەی ڕەش و سووری تاریک.

١٦ - ژانێکی زۆر لە خوارەوەی پشتەوە بەتایبەت دەوروبەری قۆڵۆن.

١٧ - حەزکردن بە گۆشەگیری بەردەوام و ڕق بوون لە ئاوەدانی وە حەز نە دانیشتن لە تاریکی بکات.

١٨ - قورس بوونی دەست یاخود قاچ بەڵگەیە کە سیحرەکە کارێ لەو ئەندامانە کردبێت.

١٩ - زۆر ئاو هاتنەوە لە کەپو یاخود ڕانەگرتنی لیکی دەم لەکاتی ڕوقیەدا ئەوە واتای وجودی سحرەکە لە دەماغی سەرە و لەڕێگەی جیوبی کەپو دەری دەکات.

٢٠ - هەست بە لاشە قورسی دەکەیت بەتایبەت بۆ ئەنجامدانی عیبادەت وە زوو ماندوو ئەبێت بەبێ هۆکار وە قەلەقیەکی زۆر و بەردەوام.

ئەوانەی سەرەوە دیارترین نیشانەن بۆ کەسی سیحر لێکراو بەتایبەت **سیحری مأکول** وە بەهەمان شێوە نیشانەشن بۆ **سیحری المشروب** : سیحری خواردنەوە

.

.

ئەوەش ئەو ئایەتە کاریگەرانەی کە عیلاجی ڕاستەوخۆن بۆ چارەسەری ئەم جۆرە سیحرە هەم سیحری خواردن هەم خواردنەوە :

کتێبەکە دابنێ




ئەو شوێنانەی سیحری خواردن و خواردنەوەی لێ جێگیر دەبێت

نیشانەی چاک بوونەوەی :

ڕشانەوەی زۆر لەکاتی ڕوقیە و سڕ بوونی جەستەی بەشی سەرەوەی وە زۆر جار دوای چاک بوونەوە پێویستە حیجامە بکرێت وە تا مانگێ یان دوو مانگ بێتاقەت دەبێت دواتر بەویستی الله تعالی هیچی بەسەر نامینێت.

الله شیفای توشبوان بدات . . .

.

.

## سیحری ڕشێنراو : سحر المرشوش

بریتیه لەم جۆره سیحرەی : کە لەڕێگەی نوسینی ناوی جنۆکەکان و طلاسم  کە تێیدا پشت دەبەسترێت بە جنۆکە و شەیتانەکانەوە لەسەر کاغەزێک دەینوسن و دەیسوتێنن وە لەسەر شتێک دەیخوێنن کە بتوانرێت بڕشێندرێت نمونەی : ئاو و خۆڵ و خوێن کە تێیدا موی لاشەی کەسەکان و یان پیسایی کەسەکان یان ماڵەکە  تێیدا تێکەڵ دەکەن هەندێکجار ڕەنگاوی ڕەش و سوور و زەرد تێکەڵیان دەکرێت دواتر لە شوێنێک دەڕژێندرێت کە بە ئامانج گیراو بێت.

.

.

## جیاوازی ئەم سیحرە لە باقی سیحرەکانی تر چیە ؟

ئەم سیحرە بۆ کەسێکی دیاری کراو ناکرێت بەڵکو بۆ ماڵەکە بە گشتی دەکرێت یان لە شوێنی کارەکە دەکرێت. ترسناکیەکەی ئەوەیە هەرکەسێک لەو ماڵە بژیت یان نان بخوات یان بەسەردان بچێت یان لەبەردەم دەرگایان بوەستێت کاری تێدەکات ئەگەرچی ئەوکەسەش مەبەست نیە. ئەم ماڵە یان ئەم شوێنە دەبێتە جێگای جن و شەیتانەکان هەرچی بچێتە ناوی دڵ تەنگ و ناڕەحەت دەبێت وە پڕ دەبێت لە مێرولە و مار و پشیلەی زیان بەخش وە تێیدا جنۆکەی کافر دەخەوێت ئەندامانی خێزانی ماڵ تووشی دەمە تەقێ و شەڕ دەبن خۆشیان نازانن لەسەرچی توڕەبوون و عەسەبی بوون و شەڕ و جوێنی بەردەوام تێیاندا دەبێت . . . ژن دەهێنن هەر شەڕ درووست دەبێت . . . شوو دەکەن هەر بەشەڕ . . . ژن تەلاق دەدەن کچیان تەلاق دەدرێت بەبێ ئەوەی بزانیت کە ئەم شوێنە ڕشێنراوە یان بۆتە مۆڵگەی جنۆکەی **کافر** وە بۆتە شووم بەسەریانەوە

## چۆن سیحری ڕشێنراو بناسینەوە ؟

تەبعەن ئەم جۆرە سیحرە لە جل و بەرگ و ماڵ و خانوو و سەیارە و قاپ و قاچاغ و باخچە و بەردەم دەرگای حەوشە دیوی دەرەوە و . . . هتد دەکرێت. زۆر جار بەڕێگەی جنۆکەوە پۆشاکی ژێرەوەی ئافرەت یان پیاو یان پۆشاکێک کە تازە کڕاوە دەبردێت بۆ کردنی ئەم جۆرە سیحرە زۆرجار پۆشاکێک ون دەکەین نایدۆزینەوە دواتر بە شێوەیەکی

.

.

نامۆ دەکەوێتەوە بەرچاومان . . . هتد دیارترین نیشانەی ناسینەوەی ئەم جۆرە سیحرە لەماڵ ئەمانەن :

- بڵاوبوونەوەی بۆنێکی قورس بەڕادەیەک ژان دەخاتەسەرەوە ئەم بۆنە بەهۆکاری خوێندنەوەی ڕەمزە شەیتانیەکانەوەیە.

- کێشە و دەمەقاڵێی بەردەوام لەنێوان تاکەکانی خێزان بەبێ بوونی هیچ هۆکارێک .

- تێکچوونی نێوان ژن و پیاو ڕق بوون لە جووتبوون و سەرجێی.

- زۆر خەو بینین بە ماڵەوە کە پڕپەتی لە سەگ و پشیلە و ماری ڕەش و سووری تاریک .

- هەست کردن بەوەی کە هەرکاتێ لەو ماڵە بیت دڵ تەنگیت کاتێ دەچیتە دەرەوە دڵخۆشیت.

- زۆر خەواڵی بوونێکی نائاسایی.

- ڕێک نەکەوتنی هیچ کارێک.

ئەوانە نیشانەی دیاری جۆری سیحرەکەن

.

**ئەم جۆرە سیحرە بۆ چەند شت دەکرێت ؟ یاخود بڵێین : جۆرەکانی سیحری ڕشێنراو چین ؟**

یەکەم : السحر المرشوش للتفريق : بۆ جیاکردنەوەی نێوان ژن و مێرد ئەم جۆرە زیاتر ڕشانەکە لەسەر جل و بەرگی ئەم ژن و پیاوە یاخود ژووری خەوتنیان دەکەن.

دووهەم : السحر المرشوش بهدف المرض : بۆ نەخۆش خستنی کەسانێک یاخود کەسێک، ئەم جۆرە زیاتر لەبەردەم دەرگای ماڵەکە یاخود باخچەی ماڵەکە ڕشێن دەکرێت.

سێ یەم : السحر المرشوش بهدف التعطيل : بۆ پەککخستن و بەستنی قسمەتی زواج دەکرێت ئەوەش زیاتر لە بەشێکی ماڵەوە ڕشێندرێت

**نیشانەی کەسێک کە ئەم سیحرەی لێکر ابێت چیە ؟**

بە کورتی ئەمانەن :

* ژانێکی زۆر لە هەردوو قاچەکان.

* سڕ بوون و گەرم بوونی چۆک و قاچەکان.

* خاو بوونەوەی ماسولکەکان.

* ترس و دڵە ڕاوکێ و خەمۆکی بێ هۆکار و خەونی ئاڵۆز و تێکەڵ بە تایبەت دەبینیت : خۆشەویستانت لە نزیکتەوە دەمرن.

* قورسایی ڕانەکانت و ژانی جومگەکانی.

* ڕق بوونەوە لە چوونە ماڵەوە و دڵخۆش بوون لە دەرەوە.

* عەسەبی بوون و توڕەبوون لەسەر بچوکترین شت.

* دڵ تەنگی بەردەوامی ماڵەوە.

* وە کاتێ دەچیتە دەرەوە وەک بڵێی شتێک هانت دەدات بچیتەوە ماڵەوە کەچی ڕقیشت لێیەتی.

## چۆن سیحری ڕشێنراو بەتاڵ بکرێتەوە ؟

تەشتێک ئاو ( جامێ ) دەهێنیت ٧ گەڵای سیدر بە وشکی دەیخەتە ناویەوە لەگەڵ کوپێک زەیتی زەیتونی ئەسڵ دواتر ئەم ئایەتانەی بەسەردا دەخوێنیت :

یەکەم : سورەتی ( الفاتحة ) حەوت جار

دووهەم : الإخلاص و الفلق و الناس یەکێ سێ جار سێ جار

سێ یەم : ئەم ئایەتانەی دادەنێم لەخوارەوە

.

قال تعالى: "يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ إِنْ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ فَانفُذُوا لا تَنفُذُونَ إِلاّ بِسُلْطَانٍ".

"وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ".

قال تعالى: "قَالُوا يَا مُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ نَحْنُ الْمُلْقِينَ (١١٥) قَالَ أَلْقُوا فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ (١١٦) وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (١١٧) فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١١٨) فَغُلِبُوا هُنَالِكَ وَانْقَلَبُوا صَاغِرِينَ (١١٩) وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ (١٢٠) قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ (١٢١) رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ (١٢٢)".

قال تعالى: "قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُۖ بِيَدِكَ الْخَيْرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ".

قال تعالى: "فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَواۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ".

دواتر بۆ ماوەی ٤ سعات بێ دەرهێنان هەردوو قاچەکان بخەیتە ناوی، کە ڕشایتەوە یان کاتێ قاچت خستە ناوی سڕ بوو تا دوای ٤ سعات سڕی نەما ئەوە بإذن الله چاک بوویتەوە. وە ماڵەکەت بە گشتی جگە لە حەمام و مرافق دەڕشێنیت بەم ئاوە بۆ دەرکردنی جنۆکە و شەیتانەکان بە ویستی الله.

.

.

الله شیفاتان بدات . . .

لینکی ڤیدیۆ

ئەوەش ڕێگای بەتاڵ کردنەوەیەتی بە عەمەلی وە مەچن بۆلای هیچ کەسێک هەر بەخۆتان لای خۆتانەوە  بیکەن بە ئیزنی الله تعالی شیفا دێت.

تێبنیەک دەربارەی سیحری ڕشێنراو لە بەردەم دەرگا و ناو ماڵ : ئەگەر بێتوو بەم ڕوقیە و بەتاڵ بوونەوە هەر کاریگەری درووست نەبوو یاخود دوای بەتاڵ کردنەوەش هەر کێشە و ژان هەبوو ئەوکات مەجبور دەبێت خانووەکە چۆڵ بکرێت وە خانوو بگۆڕدرێت گەرنا بە چەندین ساڵ لەناو سحرەکە دەژین ماڵ هەیە دەیناسم ٧ بۆ ٨ ساڵە گیرۆدەن بۆیە کۆتا عیلاج و چارەسەر جێهێشتنی خانووەکەیە وە گۆڕینی ئەشیای ناو ماڵ و جل و بەرگ . . . فالله خیر حافظا.



.

.

## سیحری نەخۆشی : سحر المرض

سیحری نەخۆشی بریتیە لە : گۆڕینێکی لەناکاوی حاڵی کەسێک کە پێشتر هیچ نەخۆشیەکی نەبوو زۆر جار بەڕادەیەک نەخۆشی دەخات دەیکوژێت. ئەم جۆرە سیحرە ساحیر لەڕێگەی وەرگرتنی ناوی کەسەکە و دایکی کارەکە دەکات دواتر لەسەر پێستەی ئاژەڵێکی قوربانی کراو بۆ شەیتان دەیسوتێنێت بە خەڵوز. ناوی کەسە سوتاوەکە دەیکاتە بوخر و دەخرێتە ئاگرەوە

بەڵگەش لەسەر هەبوونی ئەم جۆرە سحرە :

الله تعالی دەفەرمووێت : وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ * ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ

الطبري لە حسن ەوە ئەویش لە قەتادە ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : نەخۆشیەک لە شەیتانەکانەوە بۆی گوازراوەتەوە بە ئیزنی الله دوای ئەوەی ماڵ و مناڵی گشتی ڕۆشتن (تفسیر الطبري 18/ 250 )

وە دەوترێت شەیتان برینی خستە جەستەی ئەیوبەوە صلى الله عليه وسلم تا لێی کردە دەرد.

القرطبي دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت : هیچ کەسێک ئینکاری ئەوە ناکات کە شتانێک لەسەر دەستی ساحیر ڕوودەدات کە بەدەرە لە سرووشتی مرۆڤ نمونە : نەخۆشی

.

.

دەخات و شێتی دەکات وە نێوان هاوسەران جیا دەکاتەوە (الجامع لأحكام القرآن – 2/ 42).

کەواتە ساحیر دەتوانێت لە ڕێگەی جنۆکە و شەیتانەوە نەخۆشی درووست بکات لە جەستەی مرۆڤ وە شێتیشی بکات.

نمونەیەک لە نەخۆشی کە هۆکار جنۆکە و شەیتانەکانن :

## الطاعون

فەرموودەیەک هەیە ئیمام ئەحمد و ابو یعلی الموصلي و البزار و الطبري دەیگێڕنەوە کە سەحیحە ئەویش فەرموودەی أبي موسی الأشعري ە کە دەڵێت : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت : لەناو چوونی ئومەتەکەم بە تانەدان و تاعونەوە دەبێت . وتیان : ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم زانیمان تانەدان چیە بەڵام تاعون چیە ؟ وتی : گرتن و بریندارکردنی دوژمنانتە لە جنۆکەکان وە مردنی موسڵمان پێی شەهیدیە

الطاعون : الکلاباذي دەڵێت : دوو بەشە :

* بەشێکی بێ هۆکار تووشت دەبێت ئەویش لە ڕێگەی جنۆکەکانەوە تووش دەکرێت بە ڕێگەی ساحیرەوە سەرەتاش تاعونەکە لە سکەوە سەر هەڵدەدات واتە : باطن ی دواتر پەل دەکێشێت بۆ جەستەی دەرەوە .

.

* بەشێکی تریشی بەهۆی ڤایرۆساتە.

(فتح الباري لابن حجر ج١٠/ص١٨٠)

وە کاتێ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سیحری لێکرا نەخۆش کەوت ئەوەتە البیهقي دەگێڕێتەوە لە ابن عباسەوە : مرض رسول الله صلى الله عليه وسلم مرضا شديدا، فأتاه مَلَكان، فقعد أحدهما عند رأسه والآخر عند رجليه، فقال الذي عند رجليه للذي عند رأسه: ما ترى؟ قال: طُبَّ، قال: وما طُبَّ؟ قال: سُحِرَ، قال: ومَنْ سَحَره؟ قال: لَبيد بن الأعصم اليهودي، قال: أين هو؟ قال: في بئر آل فلان تحت صخرة فيرَكِيَّة، فَأْتوا الرَّكِيَّة، فانزحوا ماءها، وارفعوا الصخرة، ثم خذوا الكُدْية وأحرقوها،

کەواتە سیحرەکە پێغەمبەری خراپ نەخۆش خست صلى الله عليه وسلم وە ڕیوایەتێک لە موطأ ی ئیمام مالیک هاتووە سیحری نەخۆشیان لە دایە عائیشە کرد

## چۆن سیحری نەخۆشی ڕوودەدات ؟

تەبعەن بە دوو ڕێگا دەکرێت :

* ساحیر لەگەڵ کردنی سیحرەکە لەو کەسە هەڵدەستێت بە ناردنی جنۆکەیەکی نەخۆش لەگەڵ سیحرەکە کە نەخۆشیەکانی : دڵ و جەرگ و برین و ڤایرۆسات ی هەبێت بۆ ئەوەی هەرکاتێ جنۆکە نەخۆشەکە ژان و ئازاری هات کەسی مسحوریش ژانی دەبێت چوونکە سرووشتی جن وایە زاڵ دەبێت بەسەر کەسی مسحوردا هەر بۆیە کاتێ کەسی

مسحور ژان دەیگرێت بنەماڵەکان دەیبەنە دکتۆر و فحس دەبینن هیچ عەیبی نیە ئەوەش بەهۆی ئەوەیە جنۆکەکە ئەوکاتی فەحس لێی جیا دەبێتەوە یاخود

ناهیلێت نەخۆشیەکەی تحدید بکرێت بۆیە سەرئەنجام لە پرۆسە پزیشکیەکان بێ عەیب و سەلامەت دەردەچێت.

* یاخود ساحیر جنۆکەیەکی زانا دەنێرێت بۆ چاندنی ڤایرۆساتی پیس لە جەستەی مرۆڤەکە هێدی هێدی وەک حەب و دەرمان لەسەری زیاد دەکات تا سەرئەنجام لاوازی دەکات، وە کاری یەکەمی ئەم جنەش ئەوەیە کە موخی مراکزی عەسەبیەتی مسحور دەگرێت هەڵدەستێت بە پەک خستن و وەستاندنی دەمارە هەستیارەکانی مێشک سەرئەنجام شەلەل دەماغ و کوێربوون و پەک خستنی ئەندامی کارای جەستە.

نیشانەکانی ئەم جۆرە سیحرە :

نەمانی تەرکیز و زاکیرە و لەبیرچوونەوەی بەردەوام ژانێکی زۆری سەر و پشتە ملەکانی بە گشتی سیحری نەخۆشی لە دوو ڕوویەوە نیشانەکانی بەدیار دەخات :

یەکەم : **نیشانەکانی جەستە** :

* ژانێکی بەردەوام لە یەکێک لە ئەندامەکانی جەستەدا.

* ڕودانی زۆری عەسەبیەت و صرح.

* شەلەل ی ئەندامێک یاخود جەستەی بە گشتی.

* پەکخستنی یەکجاری ئەندامی حەواس : چاو یاخود بۆن تان بیستن . . . هتد

* یاخود بە فوجئەتی نەمانی یەکێک لە حاسەکان دوای ماوەیەک دێتەوە

* لاوازیەکی گشتی لە جەستە و دەست نەچوون بۆ کردنی هیچ شتێک

* ژانەسەری بەردەوام بەبێ هەبوونی لایەنی پزیشکی و بێ هۆکار.

* تەنگە نەفەسی قورس وەک بڵێیت : یەکێک لەسەر سنگت دانیشتووە.

* هەبوونی جوڵەی لا ئیرادی لە جەستە بە ئاشکرا دەبینیت و هەست دەکەیت شتێک لە جەستەت هەیە.

* ژانی پشتە سەر و پشتی عمودی فەقەرات بەبێ سەبەب.

* هەبوونی ژانی بەردەوام لە عەضلاتەکان.

* هەڵوەرینی قژی ئافرەت وە بە هیچ عیلاجێکی پزیشکی ڕێگەی لێ ناگیرێت.

* بەردەوام ژانی مەعیدە و جیهازی هەزمی و ڕشانەوەی نا سرووشتی و بەردەوام.

دووهەم : **نیشانەکانی نەفسی و ڕۆحی** :

* هۆگری گرتن بە تەنهایی و ڕق بوونەوە لە کۆبونەوەی خێزانی.

* ڕق بوونەوە لە خزم و نزیکەکانت.

* نەمانی متمانەی مطلق بە نزیکەکانت.

* تێڕامان و سەیرکردنی نا سرووشتی بۆ شتەکان.

* ترسی ناسرووشتی بەتایبەت کاتێ چاوی بە سەگ و پشیلە دەکەوێت مچوڕک بە جەستەی دادێت.

* ترسێکی زاڵ بووی زۆر لە کاتی تەنهاییدا.

* هەمیشە هەست دەکات کەسێک چاودێری دەکات بەتایبەت تەنها بێت وا هەست دەکات تارمایی دەبینێت و هەستی پێدەکات.

* گریانی دووبارەی  بێ هۆکار.

* هەناسە تەنگی بەتایبەت لەکاتی ڕۆشتندا.

* قەلەقی و دڵ تەنگی زۆر.

* لەبیرچوونەوەی بەهێزی شوێن و کەسەکان.

* وە خەون بینینی زۆری بێ واتا یاخود تێکەڵ یاخود سەگی ڕەش پێی دەوڕن یاخود بەدوای دەکەون یاخود پشیلە دەوری گرتووە . . . هتد

.

سحر الإستحاضة ( سحر النزيف ) : سيحری خوێنه بچڕكەی ئافرەت یاخود سیحری نەزیف بوون:

ئافرەت تووشی نەزیف بوونێک دەبێت کە بەردەوامە و بچڕانی نیە یاخود بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لە غەیری کاتی استحاضة تێیدا ئافرەت گشت جەستەی خاو دەبێتەوە دەستی هیچ کارێکی داخلی و خارجی ماڵ ناگرێت هەمیشە ترسێکێ بێ هۆکاری لە دڵە و تەواو لاوازە و خمول و کسول ە.

بەڵگە لەوەی نەزیف بوونی بەردەوامی ئافرەت لە شەیتانەوەیە :

حمنة بنت جحش رضي الله عنها چوو بۆماڵی زینب بنت جحش ی خوشکی کە هاوسەری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو حمنة دەڵێت : من لە استحاضەیەکی زۆری بەردەوامی بەئازار بووم کە زۆر بە شیدەت دەردەچوو ( واتە : بەردوام خوێنی پچڕ پچڕ دەبینم کە واتە نەزیف بوون ) چووم بۆلای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێم وت : ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم من خوێن پچڕکە و نەزیف بوونم زۆرە ئایە ڕێگریم لێدەکات لە نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : پارچە قوماشێکی پەمۆ بێنە وە بیخەرە سەر فەرج بۆ ئەوەی خوێنەکە ڕاگری و نوێژ و ڕۆژووەکەت بگرە حمنة وتی : لەوە زیاتر دەردەچێت ئەم شتە ڕای ناگرێت و پەمۆ هێزی نیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : کەواتە جلێک بێنە بیخەرە سەر پەمۆکە حمنة وتی : ئەوەش

.

.

ڕای ناگرێت چوونکە بەکۆڵ و زۆر دێتە خوارەوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی : کەواتە دوو حوکمت بۆ دەدەم :

یەکەم : بۆ هەموو نوێژێک خۆشۆردن بکە

یان :

دووهەم : نێوان الظهر والعصر والمغرب والعشاء کۆبکەوە سێ جار خۆت بشۆرە بۆ الظهر و العصر یەک خۆششتن بۆ المغرب و العشاء یەک خۆششتن بۆ الفجر یەک خۆششتن

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی : لەم دوو هەڵبژاردەیە کامت بۆ گونجا بکە خۆت شارەزاتری بە حاڵی خۆت چوونکە ئەم خوێنە بەردەوامە و بە شیدەتە رَكْضَةٌ من رَكَضَات الشيطان : تێکەڵکردن و ڕێگۆڕکێ کردنی خوێنەکەیە بۆ ئەوەیە سرووشتی عادەت تێکبات و لەبیرت بباتەوە لە ئەنجام پەکت بخات لە پاکی و نوێژ و ڕۆژووت لە حوکمی الله عادەی سرووشتی ٦ یان ٧ ڕۆژە دوای ئەوە بەرنامەت درووست بکەوە ( سنن أبي داود برقم : 267 )

ابن القیم دەڵێت : سیحر کاریگەری هەیە لەسەر نەزیف بوونی بە شیدەت و بەردەوامی ئافرەت بۆیە بەم شتەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی عیلاجی بکە وە نیشانەیەتی (بدائع التفسير 5 / 411 : 412 )

عیلاجی ڕوقیەی شەرعی کەمێکی تر ان شاء الله دادەینێم بۆ سیحری نەخۆشی

.

.

(برنامج الاغتسال لعلاج سحر **المرض**) بەرنامەی خۆشۆردن بۆ چارەسەری سیحری نەخۆشی :

دوای پشت بەستن و تەوكولی ڕەها بە الله تعالی ئەم كردارانە بكە :

* جامێكی ئاو بێنە ٢٠ لتر ئاوی تێبكە تێیدا حەوت گەڵای سیدر بخەرە ناوی ئایەتەكانی :

-- فك السحر : بەتاڵ كردنەوەی سیحر.

-- ايات فك العقد : ئايەتەكانی كردنەوەی گرێی سیحر.

-- ايات الشفاء : ئايەتەكانی شیفا.

-- ايات الحرق والعذاب : ئاياتەكانی سوتاندن و عەزاب دانی جنۆكەكان.

* بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ خۆت بەم ئاوە لەسەر خوێنراوە بشۆرە بەمەرجێک لە حەمام نەبێت.

* پێش داكەندنی جل و بەرگت ئەوە نزایە بكە : **بسم الله الرحمن الرحيم اللهم احجبنا عن أعين الجان والشيطان** وە لەكاتی لەبەر كردنی : **الحمدلله**

* ماڵەوەت جگە لە مرافق و حەمام بڕشێنە بەم ئاوە.

* ئەم كردارانەی سەرەوە بۆ ماوی ٢١ ڕۆژ ئەنجام بدە واتە : سێ جار دوبارەی بكەوە

.

.

**به ئیزنی الله تعالی شیفای عاجلت بۆ دێت . . .**



## وێنەی منداڵەکانتان مەخەنە بەرسیحری چاوەکان

برای خۆشەویستم خوشکی ڕێزدارم پەیامێکی دڵسۆزانە لەم برایەت وەرگرە :

سوێند بە ذات ی الله تعالی گەر بێتوو ناونیشانی چەند ماڵێکت پێبدەم تا بچیت سەیری منداڵەکانیان بکەیت کە چاو نەفەس لێی داون یاخود سیحریان لێکراوە ئەوکات تا قیامەت وێنەی هیچ منداڵێکت بڵاوناکەیتەوە وە بە کەسی نیشان نادەیت چوونکە ئاگرێکی مەترسیدارە لە چاوە پیس و حەسودەکانەوە دەردەچێت بۆ ڕۆح و گیان و شێوەی پاکی منداڵەکەت. کوڕی خاڵێکم تەمەن ٥ ساڵان جوانیەکی بێ وێنە بەهۆی بڵاوکردنەوەی وێنەی لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان کەوتە بەرچاو و حەسادەت کە تەنها یەک هەفتەی خەیاند لەڕۆژی شەممەوە کەوتە نەخۆشخانە بە سەدان فحس و فحوس بەبێ هەبوونی هیچ نەخۆشیە ڕۆژی هەینی دواتر خرایە ژێر گڵەوە بۆیە ڕەجائەن هەرچی وێنەی

.

منداڵتە و خۆت و نزیکەکانتە بسڕەوە تا ئەم ئاگرە توشت نەبووە  ساحیرێک دوای تەوبەکردن ئیعترافی بەوە کردووە تەنها بە وێنەی فەیسبوک و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان سیحرم لە ٢٥ کەس کردووە ٨ یان بە سیحری مردن . . . بۆیە ڕەجائەن ئاگاداربن و بەهۆش خۆتان وەرنەوە بۆچی لە پێناو دوو لایک و کۆمێنت کارەسات و سیحر و چاوپیسی دەخەیتە ماڵ و ژیانتەوە بۆیە گەر خوێنەری ئەم پۆستەی هەر ئێستا هەرچی ڕەسمە هی مناڵ و خۆتە بسڕەوە بۆ یەک چرکەش دوای مەخە چوونکە ئاگات لە حاڵێک نیە  کە خەڵکانێک تێیدا دەژین . . .



# كارەسات ببينن!!!!

بۆ ئەو بەڕێزانەی وێنەدەگرن و بڵاوی دەکەنەوە یاخود ئەو برا و خوشکەی لەکاتی مارەبڕین و زواجدا وێنەدەگرن وە ڕێگە دەدەن خەڵک وێنەیان بگرێت ڕەجائەن بەخۆ وەرنەوە بەتایبەت بۆ ئەو خوشک و  برایانەی گلەیی سیحری بەستن و جوت نەبوون دەکەن برا هەیە تەنها بە وێنەگرتنی ٩ مانگە کوڕە و خێزانەکەی کچە و نەبۆتە ژن یەکتریان لێبۆتە سەگ و بەراز و مانگا ببینن بەم جۆرە سیحرتان لێدەکرێت.





## سیحری حەیوانات

سەگ ، پشیلە ، باڵندەکان ،کەمتیار بەتایبەت مێ ، مشکو هەندێکی تر

ئەوانە دەخرێنە سیحرەوە وە بەکاریان دەهێنن بۆ سیحری ڕەش بەتایبەت وە زیاتر بەکار دەهێنرێن بۆ تێکدانی سەقامگیری و ئاسودەیی ماڵ وە ویستی دەرکردنیان لەو خانووە وە تێدا دەهێنرێنە خەونی دانیشتوانی ماڵەکە.

عیلاجیان ئاسانە بإذن الله . . .

.

جامێک ئاو بێنە (٧) گەڵای سیدر بخرێتە ناوی ٧ فاتیحە و سێ اخلاص و الفلق و الناس بخوێنە بەسەر ئاوەکە ئەم نزایانەش بەسەریا بخوێنە :

(أعوذُ باللَّهِ السَّميعِ العليمِ منَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ من همزِهِ ونفخِهِ ونفثِهِ)

(أَعوذُ بكَلِماتِ اللهِ التامَّاتِ، الَّتي لا يُجاوِزُهُنَّ بَرٌّ ولا فاجرٌ، مِن شرِّ ما خلقَ، وذرأَ، وبرأَ، ومِن شرِّ ما ينزِلُ مِن السَّماءِ ومِن شرِّ ما يعرُجُ فيها ومِن شرِّ ما ذرأَ في الأرضِ وبرأَ ومِن شرِّ ما يَخرجُ مِنها، ومِن شرِّ فِتَنِ اللَّيلِ والنَّهارِ، ومِن شرِّ كلِّ طارقٍ يطرُقُ، إلَّا طارقاً يطرقُ بِخَيرٍ، يا رَحمنُ)

(بسمِ اللهِ الَّذي لا يضرُّ معَ اسمِهِ شيءٌ في الأرضِ ولَا في السَّماءِ، وَهوَ السَّميعُ العليمُ)

(باسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ، مِن كُلِّ شيءٍ يُؤْذِيكَ، مِن شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ، أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ، اللَّهُ يَشْفِيكَ باسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ).

(اللهم إني أسألُك العافيةَ في الدنيا والآخرةِ، اللهم إني أسألُك العفوَّ والعافيةَ في ديني ودنياي وأهلي ومالي، اللهم استرْ عورتي وآمنْ روعاتي، اللهم احفظْني مِن بين يديَّ ومن خلفي وعن يميني وعن شمالي ومن فوقي، وأعوذُ بعظمتِك أن أُغتالَ مِن تحتي)

(اللَّهمَّ إنِّي أعوذُ بوجهِكَ الكريمِ، وَكَلماتِكَ التَّامَّةِ، مِن شرِّ ما أنتَ آخذٌ بناصيتِهِ، اللَّهمَّ أنتَ تَكْشِفُ المغرمَ والمأثمَ، اللَّهمَّ لا يُهْزَمُ جندُكَ، ولا يُخلَفُ وعدُكَ، ولا ينفعُ ذا الجدِّ منكَ الجدُّ سُبحانَكَ وبحمدِكَ).

(اللَّهمَّ إنِّي عَبدُك، وابنُ عبدِك، وابنُ أمتِك، ناصِيَتِي بيدِكَ، ماضٍ فيَّ حكمُكَ، عدْلٌ فيَّ قضاؤكَ، أسألُكَ بكلِّ اسمٍ هوَ لكَ سمَّيتَ بِهِ نفسَك، أو أنزلْتَه في كتابِكَ، أو علَّمتَه أحداً

.

.

من خلقِك، أو استأثرتَ بهِ في علمِ الغيبِ عندَك، أن تجعلَ القُرآنَ ربيعَ قلبي، ونورَ صَدري، وجَلاءَ حَزَني، وذَهابَ هَمِّي).

(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بكَ مِنَ العَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَعَذَابِ، القَبْرِ اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَن زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بكَ مِن عِلْمٍ لا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لا تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لا يُسْتَجَابُ لَهَا).

ماڵەوەی پێ برِشێنن بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ ئەم کردارە بکەنەوە وە خۆتانی پێ بشۆرن لە غەیری حمام وە ڕۆژانەش سعاتێک **سورەتی بەقەرە** لێبدرێت دوای ئەوە بە ویستی الله ماڵەوە و خەون و شتەکان پاک دەبنەوە وە ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە گوێ بگرن لە ڕانەگرتنی سەگ و حەیواناتی زیان بەخش بەبێ هۆکار و عوزر.

.

.

## هاوسەران هۆشیاربن :

زۆرێک لە هاوسەران دوورن لە وەسیەت و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم یەکێک لە ترسناک ترینی ئەو شوێنانەی کە تێیدا جن دەچێتە ژوورەوە فەرجە واتە عەورەت ڕێچکە و دەرگایەکە تێیدا جنۆکەکان دەچنە ژوورەوە وە جنۆکە دەچێتە ڕەحمی ئافرەتەوە تێیدا جێگیر دەبێت بۆ لەباربردن و کوشتنی منداڵ و ڕانەگرتنی منداڵ لەکاتی درووست بوونیدا بەپێی اعترافی جنۆکەکانەوە لەوێوە داخل دەبن وە لەوێوە داخل دەبن بۆ عەورەتی پیاوەکە و بەستین و جووت نەبوون ڕودەدات وە تێدا سیحری التفریق و ڕق درووست دەبێت لەنێوانیان.

### چۆن ڕێگە بگرین ؟

با من ئامۆژگاریەکی خۆشەویستمان صلی الله علیه وسلم ـت بیربهێنمەوە کە ڕێگری کولی و یەکلاکەرەوەیە بۆ تووش نەبوون ئازار نەدانی خۆت و هاوسەر و ئەو شتەش کە لەنێوانتاندا درووست دەبێت.

خۆشەویست دەفەرموویت : (لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ : بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ لَمْ يَضُرَّهُ ) البخاري ومسلم وكتب السنن

.

.

واتە : ئەگەر هەر یەکێک لە ئێوە ویستی بچێت بۆلای هاوسەرەکەی بۆ جوتبوون با بڵێت : 'بەناوی الله، پەروەردگارا دوورمان بخە لە شەیتان وە شەیتانیش دوور بخە لەو شتەی کە لەنێوانمان دەبەخشیت' کە خوێندت ئەم منداڵە هیچ زیانی پێناگات.

قاضي عياض لەشەرحیدا دەڵێت : جن و شەیتان ناتوانن بچنە ژوورەوە وە بچنە لاشەیانەوە.

ابن حجر دەڵێت : منداڵی ساڵح دەردەچێت وە شەیتان لەکاتی بوونیدا قونجیکەی لێنادات

**سوود :**

گلەیی دەکەیت منداڵ زۆر بێ ئەدەب و بێ حاڵ بووە بەڵام بێ ئاگا لەوەی لەکاتی درووست بوونیدا بسم الله لەسەر نەکراوە وەک ابن حجر دەڵێت : هۆکاری سەرەکیە بۆ ساڵح بوون.

وە تێیدا : ڕێگر دەبێت لە سحر تسقيط الجنين : سیحری لەباربردنی منداڵ کە داهاتوودا هیچ مقدر نەبێت باسی دەکەین

وە لە کەمێک ڕیوایەت هاتووە : سەرجێی باشترین کات دوای نوێژی بەیانیە چوونکە شەیتانەکان خەوتوون دوای عیشا شەیتانەکان بەخەبەرن . . .

.

## ترسناکیی شهوەت :

برایان و خوشکانی ئەزیزم شهوەت مەخلوقێکە و سرووشتی مرۆڤە وە گشت لا بەبێ جیاوازی کەم و زۆر خاوەنی شهوەتین هەندێک بە حەڕامی بەکاری دەهێنن وە هەندێک بە حلاڵی . وە شهوەت لە جەستەی هەموو کەسێک حەزێکی محدودە مرۆڤ توانای هەیە تا ڕادەیەک کۆنترۆڵی بکات بەڵام هەندێک زیاد تێپەڕ دەکەین بە سەیرکردنی گرتە سێکسیەکان شهوەتەکان درورژێندرێن لە ئەنجامدا جنۆکەکان لەڕێگەی بۆڕی شهوەتەوە داخلی ژوورەوە دەبن بەتایبەت جنی عاشق کە ان شاء الله باسی لێوە دەکەین بۆیە لە اللە بترسن و دوور کەونەوە لەو شتانەی شهوەت دەجولێنن بەتایبەت وێنە و ڤیدیۆ و نوسین و چات وە خەوتن بە فکری سێکسەوە تەقوای اللە بکەن و خۆتان توشی مس ی جنۆکەکان مەکەن چوونکە خێراترین ڕێگایە بۆ داخل بوونی جەستە.

.




سحر تعطيل الرزق : سیحری پەکخستنی کار و کاسبی و ڕزق

یان ناوێکی تری لێدەنرێت :

سحر وقف الحال : سیحری ڕاگرتنی حاڵی مرۆڤ

پێناسەی :

جۆرە سیحرێکە دەکرێت کە تێیدا مەبەست و ئامانج پەک خستنی حاڵی کەسێکە لە کار و پەیداکردنی ڕزق، وە ڕق درووست دەکات لەدڵی کەسێک بەرامبەر کار و کاسبی وە وای لێدەکات ئەوەی هەشی بێت بە ئیسراف و خەسارەت مەندی ئەیتاوێنتەوە تا ڕادەیەک کەس ناتوانێت متمانەی پێ بکات بۆ کاری کڕین و فرۆشتن وە مەبەستی سەرەکی ئەم جۆرە سیحرە : تەنگی خستنە سەر ئینسانە لە پەیداکردنی ڕزق وەک خەڵکانێک دەڵێن :

.

.

ڕزقم سواره ئەوەش دیاره لە فیتنەی شەیتانەكانە كە تەوكول لە مرۆڤ دادەڕنن بەوەی كە تەنها الله ڕازقە بۆیەش تووشی ئەم كارەساتە دەبین دڵنیابە هیچ مخلوقێك نیە ڕێگر بێت لەوەی الله ڕزقت بدات چوونكە الله تعالی دەفەرموویت: ( وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ) هیچ مخلوقێك نیە لەسەر ڕووی زەوی ئیللا الله ڕزقی دەدات بە كەم و زۆر . بۆیە ئەو قەناعەتە فڕێ بدە كە بڵێت : ڕزقم سواره بەڵام تاخیر بوونی ڕزق و ڕێگری كردن لە ڕزق سەبەبكار الله تعالی یە نەوەك خەڵكی ئەوشتە بزانە :

## جۆرەكانی ڕزق :

* **الرزق المقسوم** : ڕزقی دابەش كراوە ئەو جۆرە ڕزقێكە بەسەر مؤمن و كافر خراپ و باش دابەش كراوە وە بەندە داوای دەكات وەك الله تعالی دەفەرموویت ( وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ) ئەوە بڕاوەتەوە مرۆڤ بە ڕێگای ماندوو بوون پێی ناگات بەڵكو الله لە زانستی خۆیدا بۆی پێچاوەتەوە.

* **الرزق المكفول** : ڕزقی تەكلیف كراو : ئەو جۆرە ڕزقەیە كە بەستراوەتەوە بە ماندووبوون و تێكۆشانی مرۆڤەوە بەڵام لە ئێمە ونە كە كەی بۆمان دێت و كەی الله پێمانی دەبەخشێت ئەوەی لەسەر ئینسانە هەوڵدانە بۆ پەیداكردنی بە حلاڵ الله تعالی

.

.

دەفرموویت ( هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ )

'فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا' واتە : بگەڕێ لە کون و قوژبنەکانی زەوی بۆ کار و ڕزقێکی حلاڵ وە بخۆ لەو ڕزقەی پێت دەدرێت . . . کەواتە دەبێت خۆت تێکۆشان بکەیت بۆ کار و کاسبیەکی حلاڵ دانیشتن و داوای ڕزق کارێکی دەبەنگ و بێ عەقلانەیە .

* **الرزق الموعود** : ڕزقی بەڵێن پێدراو : جۆرە ڕزقێکە الله تعالى بەڵێن دەدات بە بەندەکانی بەڵام بە مەرجی تەقوا بەبت ماندوو بوون وەک الله تعالى دەفەرموویت : ( وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ۚ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ) الطلاق (فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ) نوح .

ابن تيمية دەڵێت : هۆکارەکانی پەیدا کردن و بەدەست کەوتنی ڕزق گشتیان لەژێر قەدەری الله تعالى یە جۆرە ڕزقێک کە الله دەیبەخشێت لەڕێگای جوهد و ماندووبوونی ئینسان خۆیەتی . گەر بێتوو ئیهمالی بکات الله تعالى ش پێی نادات بەڵام هەندێک ڕزق هەن بەبێ ماندوو بوون وەدەستی دەکەوێت نمونە : باوکی دەمرێت میرات وەردەگرێت یان نزیکێکی دەمرێت میراتی دەبات (مجموع الفتاوای ٨ / ٥٤١ )

.

.

## چۆن سحر تعطیل الرزق یان وقف الحال دەکرێت ؟

ساحیر هەڵدەستێت بە ناردنی شەیتانێک یان جنۆکەیەکی باڵدار بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر کەسی مسحور تێیدا کار دەکەن بۆ فەساد کردنی کڕین و فرۆشتن بەجۆرێک خەڵک لێی دوور دەکەوێتەوە بەوەی کە بەبێ سوود ماڵ بە زیان دەدات وای لێدەکەن متمانەی خەڵک لەدەست بدات وە کەس متمانەی پێ نەکات کە کاری بازرگانی و شتی تری لەگەڵ بکات زۆرجار شەیتانەکان هەڵدەستن بە دزینی شت گەلێک بۆ ئەوەی خەڵک کەسی مسحور تۆمەتبار بکەن بە دز و کار خراپ.

شێوەکانی سیحری وەستانی حاڵ : وقف الحال :

* سحر **التخییل** : درووست کردنی کاریگەری لە دیار نەمانی شت لە کەسی مشتری وای لێدەکات خەڵک چیتر بەلایدا نەچن.

* سحر **تعطیل الزواج** : سیحری پەک خستنی زواج ان شاء الله لە کاتێکدا باسی دەکەین.

* سحر **السرقة** : سیحری دزین جنۆکەکان بەکار دەهێنرێن بۆ دزی ئەشیاکان لەماڵ یان لە دوکان . . . هتد

.

**هۆکارەکانی سیحری پەکخستنی کاروڕزق چین ؟**

* حەسودی خەڵک بەکار و کاسبیت.

* ڕق بوونەی کەسێک لێت.

* خیانەت لە هاوبەشی و کاسبیدا.

* کردنی گوناهـ و تاوان کە هۆکاری سەرەکیە بۆ درووست بوونی کاریگەری سیحرەکە.

* تێکەڵ بوونی پاروی حەڕام بە کارەکەت بەتایبەت بەژداری کردن لە ڕیبا.

* زیناکردن.

* پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی بەتایبەت دایک و باوک هەرکەسێ خراپەکار بێت بەرامبەر دایک و باوکی ڕزقی سوار دەبێت وە هۆکارە بە تووشی سیحری ڕزق دەبێت.

هەموو ئەوانە هۆکارن بۆ تووشبوون بەم جۆرە سیحرە .

**نیشانەکانی توشبوو انی ئەم سیحرە :**

* تەمبەڵی و جەستە قورس بوون

* ڕق لێبوونەوە لە کار و کاسبی

.

* خەوێکی قوڵ بە تایبەتی دوای نوێژی بەیانی دەست پێدەکات تاوەکو دوای عسر دەخەوێت .

* کاتێ دەچێتە سەر کار هەر خەو دەیباتەوە دوای ئەوە زۆر تێر خەوتووە.

* زۆر دەمەتەقێ و کێشە لەگەڵ هاوڕێکانی کار و بەرپرسانی کارەکەت.

* ماڵ بەفیڕۆ دان ماڵ توانەوە بە بیانووی دڵ گەورەیی و دەست بڵاوی.

* شاردنەوە و نەمانی ئەشیای بازرگانیەکەت.

* زەرەرکردنی گرێبەستی کار پێش تەواوبوونی.

* مردنی باڵندە و حەیوانات بەدەستی مسحور.

* تەسلیم بوونی بەتاڵی و نەگەڕان بەدوای کاری حەڵاڵ.

* نەمانی ابداع لەکارەکانی.

* دڵ تەنگ بوون لەکاتێ کەسێک کارێکت بۆ دەدۆزێتەوە حەزناکەیت بچیت وە تەنگە نەفەس دەبیت.

* حەزکردن بە گۆشەگیری.

* لەدەستدانی دەم خەندەیی بەڕوی کڕیارانەوە بۆیە لێی ڕادەکەن و چیتر شتی لای ناکڕنەوە.

* خەون بینن بەوەی لە مرافقە دانیشتووە بەڵام ناتوانێت پیسایی بکات واتە قەبزە.

.

* لەخەوندا دەبینێت نوێژ دەکات بەڵام خەڵکانێک دێن نوێژەکەی دەبڕن.

* خەون دەبینێت لەخەودا ڕادەکات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت بەڵام پێ ڕاناگات چەندین جار ئەمە ببینێتەوە بە تکرار.

* یان لە خەودا خەون دەبینێت کە ماڵی خۆت لێ ون بووە بەدوای دەگەڕێیت.

* یان لەخەوندا دەبینێت : جلێکی جوانی کڕیوە بەڵام دوای داکەنی ونی کردووە.

* لە خەویدا پیاوێک بە بێدەنگی و هێواشی بەدوای دەکەوێت.

* یان دەبینیت دەکەوێت لەسەر بەرزاییەک.

ان شاء الله عیلاجی دادەنێم کە بإذن الله شیفای بۆ دێت . . .

کتێبەکە دانێ

.



## سحر تعطيل الزواج : سیحری پەکخستنی زەواج

زەواج : پرۆسەیەکی موبارەکە لە چوارچیوەی شەرعدا یەکێکە لە مەبەست و واتاکانی شەریعەت فیترەتێکە الله تعالى خوڵقاندوویەتی کە هەردوو ڕەگەز نێر و مێ پێویست و زەروریان بەیەکەوە هەیە بۆ سوکنایی و بەخشینی ئارامی بەرۆح و جەستە بەڵام هەندێکجار ئەم پرۆسەیە تاخیر دەبێت بەبێ ئەوەی هیچ هۆکار و بەربەستێک هەبێت

.

